# مسائل الإمام

# أحمد بن حنبل

## بە کوردی

گێڕانەوەی : باوکی قاسم البغوي

ناسراوە بە : إبن بنت منيع رحمه الله

( ٢١٤هـ - ٣١٧هـ )

وەرگێڕانی : طارق حسن الكردي

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي استوى على عرشه بائن من خلقه بحده

و صلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين

أما بعد:

**گومانی تێدا نیە کە شوێن کەوتنی کردار و گوفتاری زانایانی سەلەف کە دەسگرتون بە قورئان و سونەت و شوێن کەوتەی ڕاستە قینەی هاوەڵانی رسول اللّٰه ن , وە چاولێکردنیان سەرفرازی و سەلامەتی لە دینیدا بە دوای خۆیدا دێنێت .**

**یەکێك لەو گەورە زانا یانەش ئیمام و پێشەوای ئەهلی سونە و حدیث ئیمامی أحمدە , کە خاوەنی کۆمەڵێك ڕای جیاوازە لە مسائلە فیقهی و فە رعیەکاندا[1] , بۆیە پێمان خۆشبوو کۆمەڵێك فەتوا و وتەی ئەم ئیمامە بەڕێزە بۆ ئێوەی ئازیز بخەینە ڕو, لەو بابەتانەی فەتوای تێدا داوە لە ڕوانگەی قورئان و سونەتەوە , وە**

---

[1] نەك لە نێوان زانایان و هاوەڵان تەنانەت لەنێوان مسوڵمانانیش ڕای جیاواز نیە لە بابەتە بنچینەیەکاندا کە بریتیە لە بابەتی عەقیدەیی.

**یەكێك لەو زانا بەڕێزانەی كە كۆمەڵێك لە بابەتەكانی ئیمامی كۆكردوەتەوە بریتیە لە ئیمامی بغوی ( ابن بنت منیع )**

**بۆیە وەرمان گێڕایە سەر زوبانی كوردی**

**تاوەك و شەیدایان و فێرخوازانی زانستی شەرعی لێی بەهرەمەند ببن.**

**داواكارین لە اللە بیكاتە مایەی خێر و نیەتمان بۆ زاتی خۆی پاك بكاتەوە**

# پێناسەی نوسەر

## ناو و نەسەبی:

عبداللّٰه ی کوڕی محمدی کوڕی عبدالعزیزی کوڕی مرزوبانی کوڕی سابوری کوڕی شاهنشاهه, کونیەکەی باوکی قاسمه, بغوی یه, له بغداد له دایك بوه[٢].

## له دایك بوونی:

أبوبكری کوڕی شاذان دەڵێت: گوێم لێبوو له بغوی ( نوسەر) دەیوت: له ساڵی ٢١٣ له دایك بووم.

ابن شاهین دەڵێت: گوێم لێبوو دەیوت: ٢١٤ لەدایك بووم.

خطیب البغدادي دەڵێت: ئەوەی ابن شاهین جێگیرتره.

---

[٢] الكامل لابن عدي (١٥٧٨/٤) , تاريخ بغداد (١١١/١٠) , سير أعلام النبلاء (٤٤٠/٤), شذرات الذهب لإبن عماد الحنبلي (٢٧٥/٢).

## دەست كردنی بە داواكردن و گەڕان بۆ زانستی شەرعی:

ابن شاهين دەڵێت گوێم لێبوو دەیوت: یەكەم جار حەدیسم نوسی ساڵی ٢٢٥ بوو, لە اسحاقی كوڕی اسماعیلی طالقاني.

لای باپیری خوێندویەتی بە منداڵی .

## مامۆستاكانی:

ئیمامی أحمد , علی كوڕی مدینی , علی كوڕی جعد , أبی نصر التمار , هدبة بن خالد , بشر بن الوليد الكندي , أبي ربيع الزهراني , ابن عمر القواريري , ابن عبد الله الزبيري , وە زۆرێكی دیكە.

## قوتابیەكانی:

يحي بن صاعد , ابن قانع , أبو علي نيسابوري , أبو حاتم ابن حبان , أبو بكر الإسماعيلي , ابن عدي , أبوبكر الشافعي , دعلج السجزي , طبراني , أبو أحمد الحاكم , الدار قطني , ابن شاذان , ابن شاهين , زۆرێكی دیكە.

## پیاهەڵدانی ئەهلی علم بۆ ئیمام:

أردبیلی دەڵێت : پرسیار کرا لە ابن أبی حاتم دەربارەی ئیمامی أبی القاسم البغوی , ئایا دەچێتە صحیح وە ؟ فەرمووی: بەڵێ ( واتە حەدیسی لێوەر دەگیرێت و بە جێی سیقە دادەنرێت لە حەدیسدا )

الدار قطني دەڵێت : أبو قاسمی کوڕی منیع کەم قسەی لە حەدیس کردوە , کاتێکیش قسەی تێدا کردبێت وەك داکوتینی بزمار وابوە بە ساجێکدا ( واتە جێگای متمانە بوە لە حەدیسدا ).

أبو عبد الرحمن سولەمی دەڵێت: پرسیارم کرد لە الدار قطني دەربارەی بغوی , وتی: کێوێکە لە متماتەدا , پیشەوایەکە لە پێشەواکان , وتەی ئەو لە حدیسدا باشترە لە وتەی ابن صاعد.

خطیب البغدادي دەڵێت : متمانە پێکراوە و تێگەشتنێکی باشی هەیە وزانا و بەئاگایە.

## وەفاتی:

إسماعيل بن علي الخطبی دەڵێت : أبو قاسمی بغوی وراق وەفاتی كرد لە شەوی جەژن لە ساڵی ٣١٧ی هجری ، ڕۆژی جەژن بەخاك سپێردرا ، تەمەنی ١٠٣ ساڵ و یەك مانگبوو.رحمه اللّٰه تعالی

## كتابەكە

باوكی حسين عبد الحق كوڕی عبد الخالق كوڕی أحمد كوڕی يوسف هەواڵی پێدا ین , باوكی حسين مبارك كوڕی عبد الجبار صيرفي هەواڵی پيدا ین بە ئيجازەوە , باوكی محمد حسن كوڕی محمد كوڕی حسينی خلال هەواڵی پێدا ین , باوكی عومەر محمدی كوڕی عباسی كوڕی محمدی كوڕی زكريايی كوڕی حيويە ی خزاز هەواڵی پێدا ین , وتی: باوكی قاسم عبد اللّٰه ی كوڕی محمدی كوڕی عبد العزيزی

**بغوی هەواڵی پێدا ین**

## فەرمووی:

١ _ باوكی عبد اللّٰه م بینی ئیمامی أحمدی كوڕی حنبل رحمه اللّٰه كاتێك دەستی بەنوێژ دەكرد دەستی بەرز دەكردەوە تاوەك و نێزیك گوێچ كە كانی دەبوەوە , وەكاتێك دەچوە ركوع و سەری بەرزەوە دەكرد لە ركوع , وای دەكرد[٣]

٢ _ بیستم لە ئیمامی أحمد دەی وت : وەلیدی كوڕی هشام زۆر متمانە پێكراوە[٤]

[٣] أخرجه أحمد(٤/٣١٦_٣١٧) و مسلم( ٢/١٣) و أبو داود(٧٢٣_٧٢٥) و ابن خزيمة ( ٩٠٥_٩٠٦)
[٤] وەلیدی كوڕی أبی هشام , مەدەنی, برای هشامی أبی مقدام

٣_بۆیان گێڕامەوە ئیمامی أحمد و باپیرم, وتیان: بۆی گێڕاینەوە ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم لە وەلیدی کوڕی أبی هشام لە أبو بکری کوڕی محمدی کوڕی عەمری کوڕی حزم, لە عەمرەوە, لە عائیشەوە , فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قورئانی دەخوێند بە پێوە لەنوێژدا, کە دەیویست بچێتە رکوع دەوەستا هێندەی خوێندنی چل ئایەت لە قورئان[٥]

٤_گوێم لێبوو لە ئیمامی أحمد دەیوت: أبو مهاجر الرقی کە ناوی سالمە, جێی متمانەیە لە حدیث, وە پیاوێکی چاکە کارە[٦]

٥ _ ئیمامی أحمد بۆی گێڕاینەوە, علی کوڕی ثابت بۆی گێڕاینەوە, وتی: باوکی موهاجری رقی بۆی گێڕامەوە, لە مەیمونی کوڕی میهران کەوتی: موهاجرین ئەگەر بیان بینیایە پیاوێك بەسواری

---

[٥] إسناده حسن, رواه مسلم (١/٥٠٥) , والنسائي (٢٢٠/٣), وابن ماجه (١٢٢٦)

[٦] سالمی کوڕی عبداللّٰه ی الجزری, باوکی مهاجر, لە هۆزی بنی کلابە, متمانە پێکراوە

دەڕوات وە پیاوانیش بەپێ لەگەڵی بڕۆن دەیان وت: اللە بی کوژێت ئەوستەم کارە[7]

٦ _ پیاوێك پرسیاری کرد لە ئیمامی أحمد ، وەمن گوێم لێبوو وتی: چەنێك نوێژ بکەم ڕۆژی جومعە؟ فەرموی:

هەرچەند دەتەوێت

، گەرویستت شەش رکات بکە, وە ئەگەرویستت چوار رکات بکە[8]

---

[7] جێگیر بوە میمونی کوڕی مهران گوێبیست بوە لە هەندێك لە هاوەڵانی مهاجرلەوانە: ابن عمر و ابن عباس ,
أخرجه ابن سعد في الطبقات ٥٥٦/١٠, أبو نعيم في حلية الأولياء ٨٦/٤, ابن عساكر في تاريخ دمشق ١٤٢/٩.

[8] ئیمامی أحمد ریوایەتی کردوە (٤٩/٢ و٤٤٣ , ٤٤٩ ) , وە ئیمامی مسلم (٦٠٠/٢), وە أبو داود (١١٣١), وە نسائی (١١٣/٣), وە ترمذي (٥٢٣) , وە ابن ماجە ( ١١٣٢ ) , وە دارمی(٣٧٠/١ ) وە جگە لەوانیش.
بیهقی لە الکبری (٢٣٩/٣ ) لە ڕێگای سهیلی کوڕی أبی صالحە وە , لە باوکیەوە , لە أبی هرەیرە وە وتی:
پێغەمبەری خوا فەرمووی: گەر یەکێك لە ئێوە نوێژس جومعەی کرد , لەدواییدا چوار ڕکات بکات.
وە لای مسلم هاتوە بەم جۆرە: گەر یەکێك لە ئێوە نوێژی جومعەی کرد , بەدوایدا چوار ڕکات بکات.
ئیمامی مسلم هێناویەتی ( ٦٠١/٢ ) لە زوهریەوە , لە سالمی کوڕی عبداللە لە باوکیەوە , لە پێغەمبەرەوە صلي الله عليه وسلم کە لە دوای جومعە دوو ڕکاتی کردوە.
نووی لەشەرحی مسلم دەڵێت: لەم حەدیسانەدا گرنگی و سونەت بونی نوێژی دوای جومعەمان بۆ دەرەکەوێت , وە کەمترینیان دوو ڕکاتە وە تەواو ترینیان چوارە ( ١٦٩/٦ ) .

٧ _ پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد من گوێم لێبوو, چەند نوێژ بکەم لەدوای جومعە؟ چوار یان شەش , ئایا لە هەموو دوو ڕکاتێکدا سەلام بدەمەوە؟ ئیمامی أحمد فەرموی: من سەلام دانەوەم لاپەسەندە , ئەگەر سەلامیش نە دەیتەوە زیانی نیە

٨ _ پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد و من گوێبیست بوم , ئایا بەڕۆژوبم لە سەفەر؟ فەرمووی: نەخێر[٩]

٩ _ گوێم لێبوو لە ئیمامی أحمد دەیفەرموو: ئاژەڵی سائمە ئەو ئاژەڵانەن خۆراکیان پێنادرێت و خۆیان لە بەروبومی زەوی دەخۆن , پێشیان بدرێت زۆر بەکەمی , وە ئاژەڵی سائبە ئەوانەن

---

وە لە مسائل هاتوە بە ریوایەتی اسحاقی کوڕی هانیء النیسابوری,
لە ئیمامی أحمدەوە ( ٨٩/١ ) گوێم لێبوو فەرمووی: ئەوەی من هەڵیە بژێرم بۆ ڕۆژی جومعە, دوو ڕکات لە پێشەوە, وە شەش ڕکات لە دوایەوە, لە نێوان هەموو دوو ڕکاتێکیش سەلام دەداتەوە

[٩] لەبەر ئەو حەدیسەی کە هاتوە لە جابری کوڕی عبداللّٰه بە مرفوعی: ڕۆژوی سەفەر لە چاکەوە نیە( أخرجە أحمد ٢٩٩/٣) و الدارمي ١٧١٦ .

وازیان لێ هێندراوە و بۆهیچ بەکارناهێنرێن و سودیان لێ وەرناگیرێ

ئاژەڵی سائمە زەکاتی لێدەدرێت.

١٠ _ پیاوێك وتی بە ئیمامی أحمد وە من گوێم لێبوو : پێم گەشتوە کە نصاری قورئان دەنوسنەوە , ئایا ئەوە دەکرێت؟

فەرمووی: بەڵێ , نصاری قورئان دەنوسن لەبەر ئەوەی کەم بوون ئەوانەی دەیان نوسی (خوێندەوار کەم بوە)

پیاوەکە پێی وت: ئەمە سەرسامت دەکات؟ ئیمام فەرمووی : نەخێر

١١ _ گوێم لێ بو ئیمامی أحمد دەیفەرموو: سوجدە لە واجبدا سونەتە , واتە : لە نوێژی فەرزدا [10]

[10] مەبەستی ئیمام سوجدەی تیلاوەیە لە نوێژدا.

**١٢ _ پرسیار كرا لە ئیمامی أحمد منیش گوێبیست بوم : دەربارەی پیاوێك نەزری كردوە مانگێك بە ڕۆژوبێت, ئایا بە جیاواز بەڕۆژوبێت؟ (پچڕپچڕ و بەسەریەكەوە نە) فەرموی : نەخێر ئەگەر بیوتایە: سێ ڕۆژ, ئەوكات گەرویستی بوو بە پچڕپچڕ دەیگرێت.**

**١٣ _ پیاوێك پرسیاری كرد لە ئیمامی أحمد _ منیش گوێم لێبوو_ وتی: من لە شوێنێكم ڕقم لێیەتی, دایكیشم لە گەڵە لەو شوێنە, دەمەوێت لەوێ بڕۆم و بیگۆڕم , بەڵام دایكم هاوڕانیە و نایەت لە گەڵم , ئیمامی ئەحمەد پێی فەرموو: بۆچی ڕقت لێەتی؟ وتی: چونكە ولاتێكی ستەم كارە, ئیمام فەرموی: ئەگەرولاتی ستەمە دایكت جێبێڵەو دەرچۆ لەو شارە, مادام دایكت نایە لەگەڵت**

**١٤ _ پیاوێك پرسیاری كرد لە ئیمامی أحمد , وتی: من كەسێكی نزیكم هەیە و هەتیوە من بەرپرسم لە سامانەكەی كەلای منە, كەسێكی تاوان كارو لەسنور دەرچوە , داوایماڵەكەی دەكات پێی**

**بدەم؟ ئیمام فەرمووی: نەخێر , پیاوەکە وتی چەند جارێك منی بردوە بۆلای والی , وە ئەو لەقسەکردنا زیرەکتر و ڕەوانبێژترە**

**ئیمام فەرمووی: چارت نەما و توانات نەبوو بەسەر فێلٚەکەی ئەوا پێی بدە وە ,**

**١٥ _ پیاوێك پرسیاری لە ئیمامی أحمد کرد _منیش _ گوێبیست بووم , وتی: من درهەمی ورد نەکراوەم پێیە , دەمەوێت بیگۆڕمەوە بە زیوو , ئایا بیگۆڕمەوە لە کاتێکدا هەمان جۆر نین؟**

**ئیمامی أحمد فەرمووی: نەخێر, کێش بە کێش وەر گرە**

**پیاوە کە وتی ئەی ئەگەر دینارم پێبێت بیگۆڕمەوە بە کۆمەلێٚ درهەم؟**

**ئیمام فەرمووی: سەیرکە بزانە نرخەکەی گەشتەوەتە چەندە پاشان وەری بگرە.**

_ ١٦پرسيار كرا لە ئیمامی أحمد منيش گوێك لێبوو, دەربارەی پیاوێك هاوسەرگیری لەگەل ئافرەتێك دە كات, هەزار درهەمی پێدا , باوكی ئافرەتەكە هات وتی: من هیچم لانیە لەگەڵی ئامادەی كەم (مەبەست پێی ئەوشتانەبوە عادەتەن بۆ بوك ئامادە كراوە لە ڕازاوەیی و پێویستیەك كە لەلایەن ماڵی بوكەوە ئامادە كراوە)

ئەگەر دەتەوێت بەبێ ئەو ئامادەكاری و پێویستیە بیبەیت ئەوا بیبە

ئیمامی أحمد فەرمووی: ئەو ئافرەتەكەی دەوێت ئەو پێداویستیانەی ناوێت, بەبێ ئەوان بیبە

١٧_ ئیمامی أحمد فەرموی: ئەگەر پیاوێك وتی بە خێزانەكەی : حەقت بەدەستی خۆتە , ئافرەتەكە بڵێت: من حەرامم لەسەرت, ئەوا حەرامەبێت لەسەری.

١٨ _ گوێم لێبوو لە ئیمامی أحمد دەیوت: ئەگەر پیاو زەواج بکات لەگەڵ ئافرەتێك بەبێ وەلی ئافرەتەکە , وە ئافرەتە کە لە پیاوە منداڵی بوو , باشتروایە ئەو پیاو و ئافرەتە جیابکرێنەوە.

ئیمامی أحمد فەرموی : ابن المبارك یش وا دەڵێت

١٩ _ پرسیارکرا لە ئیمامی أحمد : پیاوێك لای پیاوێك شتێکی بە بارمتە داناوە لەبری قەرزێك , خاوەن بارمتەکە پێویستی بە پارەکەیەتی , پێی دەوترێت بارمتەکەت بفرۆشە و پارەی قەرزەکەت بدە

ئیمام فەرمووی: ئەگەر لای نەبوو پێی بدات وە بارمتەکەیی بۆ نەدەفرۆشرا

خاوەن قەرز دەتوانێت ڕەهنەکە( بارمتەکە) لای خۆی بهێڵێتەوە

وە ناتوانێت ڕەهنەکە ( بارمتەکە) بفرۆشێت تەنها بە ئیزنی خاوەنەکەی نەبێت

٢٠ _ گوێم لە باوكی عبداللّٰە بوو ( ئیمامی أحمد ) ساڵی ٢٢٨ھ وەپرسیاری لێكرا دەربارەی كەسێك ئیحرامی بەستوە و نێچیرێكی كوشتوە؟ فەرمووی: كەفارەتەكەی لە قورئاندایە[١١]

٢١ _ بیستم لە ئیمامی أحمد دەی فەرموو: هەموو شتێك لە قورئادا ( أو_أو ) بۆ هەڵبژاردن و سەرپشك بونە.

٢٢ _ گوێم لێبوو لە ئیمامی أحمد دەی فەرموو: یحیی وتی: شعبە وتی: حكم لە مقسم[١٢] حەدیسی كەڵەشاخی نەبیستوە[١٣]

---

[١١] اللّٰە سبحانە وتعالی دەفەرموێت: أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۚ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ , واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە ئیسلام هێناوە , هیچ گیاندارێك مەكوژن لە گیانداری وشكانی , كاتێك ئێوە لە حەرەمدان یان حج یان عەمرە دەكەن( تەنها چەند گیاندارێك نەبێت كە كوشتنیان جائیزە , وەك لە بخاری و مسلم هاتوە ) ئەگەر كوشتان ئەوا دەبێت لە هەمان ئەوەی كوشتوتانە ئاژەڵێك سەربپڕن و گۆشتەكەی بدەن بە هەژاران , یان نرخەكەی , یان بەڕۆژوو بن گەر توانای كەفارەتە كەیتان نەبوو.

[١٢] حكم تەنها ٥ حەدیسی بیستوە لە مقسم, یحیی یكوڕی قطان ژماردویەتی: حەدیسی ویتر, حەدیسی قنوت, حەدیسی عزمة الطلاق, پاداشتی ئەوەی دەكوژرێت لە وشتر, حەدیسی پیاوێك دە چێتە لای خێزانی لە كاتێك لە حەیزدایە.

[١٣] العلل للإمام أحمد ریوایة عبداللە(٤٣٣٣) و مسند علي بن جعد( ٤١٩)
بریتیە لە حەدیسی ابن عباس , كە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم كەڵەشاخی گرتوە و بەڕۆژوش بوە.
ئیمامی أحمد لە مسند هێناویەتی ( ٢١٨٦ , ٢٢٢٨ , ٢٥٣٦ , ٢٥٩٤ ) طیالسي لە مسند هێناویەتی( ٢٦٩٨ ) وە نسائی لە كبری ( تحفە: ٥/٢٢٤ )

٢٣ _ پرسیارکرا لە ئیمامی أحمد و منیش گوێبیست بووم : دەربارەی پیاوێك هاوسەرگیری كردوە لەگەڵ ئافرەتێك لەسەر كۆیلەیەك , ئایا ئەو پیاوە بەندەكە ئازادە كات؟

ئیمام فەرمووی: نەخێر ئازادی ناكات , ئەو بەندە دەبێتە هی ئافرەتەكە( چونكە دەبێتە مارەیی ئافرەتەكە)

٢٤ _ پرسیاركرا لە ئیمامی أحمد منیش گوێم لێبوو : دەربارە ی پیاوێك كراوەتە وەلی بۆ خوشك و كچەكەی , پێی دەڵێت: ئەگەر كەسێكت دی پێی ڕازی بوویت بیاندە بە شوو

ئیمام فەرمووی : زەواجەكە دروستە

٢٥ _ گوێم لێبوو ئیمامی أحمد دەی فەرموو: وای دەبینم ئەگەر پیاو ویتری كرد سەلام بداتەوە لە دوو ڕكاتدا

٢٦ _ پرسیاركرا لە ئیمامی أحمد منیش گوێم لێبوو: پیاوێك درهەمێك دەدات بە پیاوێك تاشتێكی بەو درهەمە بۆ بكڕێت

بەلاٚم تێکەڵی دەکات لە گەڵ درهەمەکانی خۆی وە , ونی دەکات؟

ئیمام فه رمووی : هیچی لـەسەر نیه

ئیمامی أحمد فەرمووی: ئەگەر یەکیانی ون کرد و نەیزانی کامیانی ون کردوه هی خۆی یان پیاوەکە _ دەبێت قەرەبوی بکاتەوە

٢٨ _ پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد منیش گوێم لێبوو : دەربارەی پیاوێك دەیەوێت قوربانیەك بکات بەلاٚم ونی دەکات و دانەیەکی دیکە دەکڕێت دوایی ونبەوەکەش دە دۆزێتەوە؟

فەرمووی :هەردووکیان سەرە بڕێت

٢٩ _ گوێم لێبوو ئیمامی أحمد دەی فەرموو: دەربارەی ئەم ئایەتە ( والهدي معكوفا أن يبلغ محله ) الفتح : ٢٥. واتە: موشریکین نەیان هێشت قوربانیەکان بگاتە جێی خۆی بۆ سەربڕین.

ئیمام فەرمووی: هەتا دەگاتە حەرەم ( واتە ئەو شوێنە بریتیە لە حەرەم)

٣٠ _ پرسیار كرا لە ئیمامی أحمد منیش گوێم لێبوو: دەربارەی پیاوێك دەرچوە بۆ پێویستیەك , وە مەبەستی حەج كردن نیە , دەر چوە لە ذا الحليفة و پاشان دەیەوێت حەج بكات؟

ئیمامی أحمد فەرمووی: دە گەڕێتەوە بۆ ذا الحليفة و احرام دەبەستێت

٣١ _ ئیمامی أحمد فەرمووی : ئەگەر نەسرانیەك مسوڵمان ببێت لە مەكە پاشان بیەوێت حەج بكات , ئەوا: دە گەڕێتەوە بۆ ذا الحليفة و احرام دەبەستێت

٣٢ _ بۆی گێڕاینەوە أحمدی كوڕی حنبل , وتی: سفیان وتی: لە ابن جریجەوە لە عطاء وە : ئەگەر سەفەربكات بە سەفەرێك , نوێژی تێدا كورت كرێتەوە , عومرەكەی هەڵوەشێتەوە

ئیمامی أحمد فەرمووی: هەڵەوە شێتەوە[١٤]

[١٤] مەبەست لە عومرەیە لە مانگەكانی حەجدا.

**٣٣ _ گوێم لێبوو ئیمامی أحمد دەی فەرموو: بۆی گێڕاینەوە یزید بە حەدیسێك وتی: شعبە لە (أشعث)ي كوڕی سلیمەوە بۆی گێڕاینەوە وتی: حدیثی یحیی ی كوڕی أبی سلیم _ أبی بلج_: گوێم لێبوو لێوەی , وە من گومانم هەیە لەوكاتەوەی بیستومە ؟ لە بغداد بیستم, واتە لە شعبەوە , وەمن لە دواوەی خەڵكەكە بووم , لەو پیاوە وە ری گرن بە عنعن ( جۆرێكە لە گێڕانەوەی حەدیس )**

**٣٤ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەی فەرموو: دراوردی كۆمەڵێك حەدیس دێنێت نازانم چین**
**وەك ئەوەی ئینكاری بكات[15]**

**٣٥ _ ئیمامی أحمدم بینی كاتێك لە نوێژ سەلامی دەدایەوە , ڕوخساری وەر دەگێڕا لە قیبلە و دادەنیشت و زیكری اللہ ی دەكرد**

---

[15] هاتوە لە (العلل و معرفة الرجال) لە ئیمامی أحمد, بەریوایەی مروذي (بە ژمارە: ٢١٠):
پرسیارم كرد لە ئیمامی أحمد دەربارەی دراوردی , فەرمووی: نازانم چیت پێبڵێم دەربارەی , دەربارەی حەدیسەكانی , وەك ئەوەی ئینكاری هەندێكیان بكات.

**٣٦ _ پرسیار کرا لە ئیمام أحمد _منیش گوێم لێبوو_ دەربارەی پیاوێك بیست دیناری داوەتە پیاوێك تا بەو پارە شتێکی بۆ بکڕێت , تێکەڵی دەکات لە گەڵ پارە کانی خۆی تا دەڕوات و شتی بۆ دەکڕێت , ئیمام وای دەبینی هیچ کێشەی نەبێت ئەم کارە**

**٣٧ _ باوکی عبداللّٰه م بینی (واتە ئیمامی أحمد) نوێژی بۆ دەکردین کاتێك قامەت دەکرا , بەلای ڕاست و چەپ لای دەکردەوە و دەی فەرموو: ڕێك بوەستن**

**٣٨_ گوێم لێبوو لە ئیمامی أحمدە وە دەیفەرموو: (جندب) واتە کوڕی سفیان هاوەڵایەتی کۆنی نیە[١٦]**

[١٦] جندبی کوڕی عبداللّٰه ی کوڕی سفیان البجلی پاشان العلقی , باوکی عبداللّٰه .

**٣٨ _ پرسیارکرا لە ئیمامی أحمد دەربارەی حەدیسی عەمری کوڕی حزم لە خێرکردن : ئایا ئەوحەدیسە ڕاستە؟ فەرمووی: وای بۆدەچم ڕاست بێت[١٧]**

**٣٩ _ پرسیارکرا لە ئیمامی أحمد و منیش گوێبیست بووم , دەر بارەی پیاوێك وەسێتی کردوە هێسرێك بکرِن بە هەزار دینار بۆ جیهاد , وە سەدیشی بۆ نەفەقە؟**

**ئیمامی أحمد فەرمووی: بۆی دەکرِدرێت وەك ئەوەی وەسێتی کردوە , زیاد ناکریٛ لەسەرو ئەمەوە هیچی تر.**

**وتی: ئەگەر بە کەمتر لە هەزار, بە پێنج سەد درهەم دەستی کەوت , یان زیاتر؟**

---

[١٧] مەبەستی پێی ئەوحەدیسەیە کە حکمی کوڕی موسی لە یحیی یکوڕی حەمزەوە , لە سلیمانی کوڕی داودەوە , لە زوهریەوە , لە أبوبکری کوڕی محمدی کوڕی عەمری کوڕی حزم , لە باوکیەوە , لە باپیریەوە , کە رسول اللّٰه بۆ خەڵکی یەمەن کتابێکی نوسی تێیدا واجبات و سونەتەکان و ئەو پارەی لەبری تاوانێك دەدرێت ئایا کوشتن بێت یان جگە لەوانە , بە عەمری کوڕی حەزمدا ناردی , ئەویش بۆ خەڵکی یەمەنی خوێندەوە , نسائی ( ٨/٥٧ ) حاکم لە مستدرك ( ١/٣٩٥ ) بیهقی لە الکبری ( ٤/٣٥٢ و٨/٨٨و٨٩ ) . بەڵام حەدیسەکە زەعیفە

## ئیمام فەرمووی: نەفەقەکەی پێ زیاد دەکرێت

٤٠ _ پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد و منیش گوێم لێبوو: دەربارەی ئەو ئافرەتانەی خوێنیان هەیە بەهۆی مندالّ بونەوە ؟

چەنێك دانیشن ئەگەر خوێنیان بینی؟

فەرمووی چل ڕۆژ پاشان خۆی دەشوات [18]

٤١ _ بۆی گێڕامەوە باپیرم وتی: باوکی بەدر بۆی گێڕاینەوە , لە علی کوڕی عبد الاعلی , لەباوکی سەهلەوە , لە مسة الأزدية , لە أم سلمة ,هاوسەری پێغەمبەر فەرمووی: ئافرەتانێك كە مندالّیان بوە , چل ڕۆژ دادەنیشتن , وە ڕوخسارمان بە گولّی ورس ڕەنگ دەکرد

---

[18] أخرجە الدار قطني في السنن( ٢٢٢/١), ابن رجب لە فتح دەفەرموێت ١٥١/٢: ڕای دروست ئەوەیە ئەگەر لە پێش ٤٠ ڕۆژ خوێنی نەما و پاك بوو یەوە دەبێت ڕۆژو بگرێت و نوێژیش بکات.

هەروەك لە سنن هاتوە لای الدار قطني ٢٢٣/١ لە ڕێگەی عبدالرحمنی کوڕی محمدی العرزمی , لەباوکیەوە , لە حكمی کوڕی عتيبەوە, لە مسە وە , لە أم سلمە وە کە پرسیاری کردوە لە پێغەمبەر ئایا: ئافرەت چەندێك دابنیشێت ئەگەر مندالّی بوو (واتە لە نوێژو ڕۆژو بوەستێت)

فەرمووی: ٤٠ ڕۆژ بە لاّم پیش ئەوە پاك بویەوە دەبێت نوێژو ڕۆژوی ئەنجامبدات.

که ڕەنگێکه له نێوان و سور و ڕەش( سورێکی تۆخ)

٤٢ _ پیاوێك وتی به ئیمامی أحمد, وەمنیش گوێم لێبوو: من دراوسێیەکم هەیە کاتێك داوای شتێکی لێدەکەم پێم دەدات, پاشان ئەویش دێت پارەم لێ قەرزەکات, ئایا من داوای لێبکەم وەك ئەوەی پێشتر داوای شتم لێکردوە؟

ئیمامی أحمد فەرمووی: هەموو قەرزێك سودی تێدا بەکاربێت حەرامە ( ئەو قەرزەکەی بۆیە داوە تا بتوانێت پارەی لێ قەرز بکات ئەمەش حەرامە چونکه پێدانی قەرزلەبەر قازانج دروست نیە)

٤٣ _ پیاوێك پرسیاری کرد له ئیمامی أحمد منیش گوێم لێبوو, وتی: من چومە بازاڕ لەوێ جلێکم بینی خاوەنەکەی بانگی دەکرد دەیوت به بیست صحاح, منیش کڕیم و مقطعة م پێی دا

ئیمام فەرموی نەخێر, تەنها ئەوکاتەی کە دەبێت ڕازی بێت خاوەن جلەکە کەئەوەی پێبدەیت

## ٤٤ _ وە پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد و منیش گوێم لێبوو: دەربارەی وتنی زیکر لەسەر شێوازی شیعرو بەکارهێنانی ئالەتی موسیقی لە گەڵیدا

## ئیمامی أحمد فەرمووی: پێم خراپە[١٩]

## ٤٥ _ پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد و منیش گوێم لێبوو : دەربارەی سڕینی شوێنەواری دەست نوێژ لەدوای دەست نوێژ؟

[١٩] ئیمامی ابن أبی حاتم لە مناقب الشافعی پەڕەی (٣٠٩_٣١٠) بە سەنەدێکی ڕاست هێناویەتی: ئیمامی شافعی دەفەرموێت : لە عراق شتێك ئەنجام دەدرا پێی دەوترا تغبیر( واتە هۆنینەوەی شیعر لە مەجلیسی زیکردا بە ئاوازو ئالەتی موسیقی , زەنادیقەکان دایان هێنابوو, خەڵکیان پێ مەژغوڵەکرد لە قورئان , بۆئەوەی لەبری قورئان خەریکی ئەوەبن.

## ئیمامی أحمد بە باشی نەزانی[20]

٤٦ _ گوێم لێبوو لە ئیمامی أحمد ، دەی فەرموو: بیلال بانگی دەدا بۆ پێغەمبەر لەدوای ئەوەی گەشتە مەدینە

٤٧ _ پیاوێك پرسیاری لە ئیمامی أحمد كرد منیش گوێم لێبوو وتی: شتێكم بە كرێم گرت لە بغداد بۆ مكە ، كاتێك گەشتمە كوفە بۆم ڕون بویەوە , ئیمام فەرمووی: دەبێت حەقی خۆی پێبدەیت , یان بیدەیتە دەست غەیری خۆی

٤٨ _ پرسیار كرا لە ئیمامی أحمد منیش گویٚ بیست بووم , ئایا ئافرەت حەج دەكات لە كاتی عیدەدا ؟ فەرمووی: بەڵێ

٤٩ _ وترا بە ئیمامی أحمد: ئەگەر ئافرەتێك لەگەڵ پیاوەكەی بوو لەڕێدا پیاوەكەی مرد؟

---

[20] ڕوخسەت هەیە و دەتوانرێت بكرێت وەك ابن المنذر لە الأوسط هێناویەتی (٤١٥/١) بە سەنەدێكی حسن لە عبيد اللّٰه ی كوڕی أبو بكر: كە أنسی كوڕی مالكی دیوە ڕوخساری وشك كردوەتەوە , بە و پۆشاكەوە كە لەسەریدا بوە لەدوای دەست نوێژ.

## ئیمام فەرمووی: هاوەڵایەتی خەڵکی دەکات گەر مەحرەمی نەبوو

**٥٠ _ وترا بە ئیمامی أحمد: ئافرەت لەماڵ دەچێتە دەربەبێ مەحرەم لەگەڵ دراوسێکەی؟**

**ئیمامی أحمد فەرمووی: نەخێر**

**٥١ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەی فەرموو: ابن أبی ذئب[٢١] سیقەیە , حەدیسی کەمە , وە کەسێکی چاکە کارە و قسەی حەق دەکات**

**٥٢ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەی فەرموو: ابن أبي ذئب لە سعیدی کوڕی مسیب دەچێت[٢٢]**

---

[٢١] محمدی کوڕی عبدالرحمن کوڕی موغەیرە کوڕی حارث کوڕی أبی ذئب, قورەیشي عامری , باوکی حارث مدنی ,١٥٨ه وەفاتی کردوە , (التقریب: ٢/١٨٤).

[٢٢] علل و معرفة الرجال بروایة عبدالله ( ٤٧٩,١١٢٢,١١٩٥)

٥٣ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەی فەرموو: ئەگەر پیاوێك شتێكی كڕی لە پیاوێك , وە كڕیار دەی زانی ئەو كەسە ئەو شتەی دزیوە , ئەوا لەو كارە لەگەڵی بەژدارە

٥٤ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو , دەی فەرموو: عبد اللّٰه ی كوڕی وەهب زانا و چاكە كارە , فەقیهە و زانستی زۆرە[٢٣]

٥٥ _ ئیمامی أحمد فەرمووی: هەواڵی پێدام كەسێك , كە ابن أبی حازمی دیوە بۆچونی مالكی بۆ عبداللّٰه ی كوڕی وهب خستوەتە ڕوو

٥٦ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەی فەرموو: رشدین وای دەبینم جێی سیقەیە , یان حەدیسی چاكە[٢٤]

٥٧ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بووو دەی فەرموو: ئەگەر لە ڕێگادا پۆشاكێكت دۆزیەوە ساڵێك بانگەوازی بۆبكە , دواتر بیفرۆشە , وە

---

[٢٣] عبداللّٰه ی كوڕی وهبی كوڕی مسلم, قورەیشی , متمانە پێكراو و خواناسە, ساڵی ١٩٧ھ وەفاتی كردوە, ( التقریب ١/٤٦٠).

[٢٤] . معجم الصحابة للبغوي ٥٤٣/٣ (١٥٣٧), الكامل لابن ٢/(٦٦٩), تهذيب التهذيب ٢/(٢٧٨٠).

به پارەکەی خێری پێبکە , وە ئەگەر کۆمەڵێك درهەمت دۆزیەوە , ساڵێك بانگەوازی بۆبکە , دواتر بیکە بەخێر[٢٥]

٥٨ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەی فەرموو: ئەگەر قامەت کرا بۆنوێژ ئەوا نوێژ ناکرێت جگە لە فەرز

٥٩ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەی فەرموو: ئەگەر پیاوێك گوێی لە قامەتی نوێژ بوو , وە دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی نەکرد بوو, دەچێت نوێژە فەرزەکە دەکات

٦٠ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو پرسیاری لێکرا دەربارەی وەرگرتنی پاداشت لە بەرامبەر کردنی کەڵەشاخ؟

فەرمووی: خراپترین کەسابەتە[٢٦]

[٢٥] الموطأ ٤٧١.

[٢٦] بخاري ٩٩/٣, مسلم ١٥/٥, الحميدي ٤٠٢, النسائي ٢٦٨/٧. ( لە حەدیسی رافعی کوڕی خدیج )

بەڵام گەرکابرای کەڵەشاخ گرەوە داوای پاداشتێکی کرد لە بەرامبەر کارەکەیدا ئەوا پێی بدەن أخرجه بخاری ومسلم و أحمد.

٦١ _ پیاوێك پرسیاری لە ئیمامی أحمد كرد منیش گوێم لێبوو وتی:

چەن الله أكبر بكەم لەسەر جەنازە؟

فەرمووی: چوار , وە سەلامێكیش دەدەیتەوە

٦٢ _ باوكی قاسم وتیی: من ئیمامی أحمدم دی چوارجار اللّٰه و أكبری كرد لە سەرجەنازە , چاشان سەلامی دایەوە بەلای ڕاستدا , وە چوە گۆڕستان و نەعلەكانی بەدەستەوە گرتبوو, بەدەستی ڕاستی

٦٣ _ پیاوێك پرسیاری لە ئیمامی أحمد كرد , منیش گوێم لێبوو, دەربارەی پیاوێك هەندێك درهەمی وردە قەرزەكات لە پیاوێك , بەڵام پارەی تەواو وەرەگرێت ( وردە نیە )

ئیمامی أحمد فەرمووی: ئەگەر مەرجی دانەنابێت خاوەن قەرز كێشە نیە , بەڵام گەر مەرجی كردبێت , دەبێت ئەوەی پێبداتەوە كە قەرزی كردوە.

٦٤ _ پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد و منیش گوێم لێبوو, دەربارەی پیاوێك دەرچوە بۆ مزگەوت , دەبینێت نوێژەکەن , وە دەبینێت پیاوێك دەسنوێژە گرێت, ئایا سونەت بکات تا ئەو پیاوە دێت؟

ئیمام فەرمووی : گەرویستی با سونەت بکات تا ئەو دێت

٦٥ _ پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد و منیش گوێبیست بووم , ئایا ئافرەت توشی حیض دەبێت لەکاتی دوو گیانیدا ؟

ئیمامی أحمد فەرمووی : جیاوازن تێیدا , تەنها ئەوەی نابێت واز لە نوێژ ناهێنێت ( واتە جیاوازن ئایا ئافرەت لە کاتی دوو گیانیدا توشی حیض دەبێت یان نا, بەلاَم نابێت واز لە نوێژەکەی بهێنێت )

٦٦ _ پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد و منیش گوێم لێبوو, دەربارەی پیاوێك ونبوە؟ ئیمام فەرمووی : ماڵەکەی دابەشە کرێت دوای چوار ساڵ

**٦٧ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەی فەرموو: حسن حەدیسی گێڕاوەتەوە لە علی کوڕی أبو طالب[٢٧] و معقلی کوڕی یسار[٢٨] و ثوبان[٢٩]**

**٦٨ _ باپیرم بۆی گێڕامەوە وتی: بۆی گێڕاینەوە هشیم, وتی: بۆی گێڕاینەوە یونس لە حسن ئەویش لە علی کوڕی أبو طالب کە وتی: گوێم لێبوو لە پێغەمبەرەوە, کە فەرمووی: قەڵەم بەرز کراوەتەوە لەسەر سێ نەفەر ( واتە تاوانیان لەسەر نانوسرێت ) بچوکێك تا**

---

٢٧ حسن کوڕی أبی حسن, یساری بصري, ریوایەتەکانی لە ئیمامی علی وە مرسەلە.

٢٨ ابن أبی حاتم دەفەرموێت: گوێم لێبوو لە باوکمەوە وتی: حسن لە معقلی کوڕی یسارەوە گوێبیست نەبوە( المراسیل پەڕەی ٤٢ ).

وە پرسیار کرا لە أبو زرعەی رازی : حسن لە کامیان گێڕاویەتیەوە؟ معقلی کوڕی یسار یان معقلی کوڕی سنان؟ حسن لە معقلی کوڕی یسار گێراویەتیەوە, لە معقلی کوڕی سنان ئەگەری زۆر دورە .

ئیمامی بخاریش لە سەحیحەکەیدا لە (بابی نکاحدا , باب لانکاح الا بولی) لە ڕێگەی یونس, لە حەسەنەوە لە معقلی کوڕی یسار....... حدیث.

٢٩ حسن گوێبیست نەبوە لە ثوبان ( التهذیب ٢٣١/٢) .

ژێری گەشە دەكات , نوستویەك تاوەك و هەڵدەستێت , شێتێك تاوەك و باشدەبێت و ژیرەبێت[٣٠]

٦٩ _ باپیرم بۆی گێڕا مەوە , وتی: هشیم بۆی گێڕاینەوە , وتی: خالد هەواڵی پێداین , لە باوكی ضحی وە ئەویش لە علی یەوە بە هەمان شێوەی پێشوو

٧٠ _ باپیرم بۆی گێڕا مەوە رحمه اللّٰه , وتی: بۆی گێڕاینەوە داودی كوڕی زەبورقان لە سعید ئەویش لە قتادەوە ئەویش لە حەسەنەوە ئەویش لە عەلیەوە: ئەویش لە پێغەمبەری خواوە هەمان حەدیسی پێشوو[٣١]

٧١ _ شیبان بۆی گێڕاینەوە , سلامی كوڕی مسكین بۆی گێڕاینەوە , أبو عتاب بۆی گێڕاینەوە لە حەسەنەوە , وتی: زیلد چوە لای معقلی كوڕی یسار, كە نەخۆش بوو, سەردانی دەكرد , وە سۆز و دڵ نەوای

---

[٣٠] سەنەدەكەی پچڕاوە , بەڵام بە حەسەنی و بە سەحیحی هاتوە وەك لای أبو داود و غەیری ئەویش( ٤٣٩٩, ٤٤٠٠ , ٤٤٠٣ ).

[٣١] زەعیفە , داودی كوڕی زەبرقانی تێدایە كە متروك الحدیثه , قال أبو زرعة واهي الحدیث , قال ابن منیع لیس بشيء.

**پێش کەش کرد, لەو کاتەدا معقلی کوڕی سیار وتی: گوێم لێبوو لە پێغەمبەری خواوە دەی فەرموو: هیچ والیەك نیە کارێك لە کارەکانی مسوڵمامانی لە ئەستۆبێت, هیچ ئامۆژگاریەکی بۆ جیٚ نەهێشتبن ئەوا اللّٰه لەسەر ڕوخساری دەی خاتە جەهەنەم ئەو ڕۆژەی اللّٰه کۆتا و سەرەتای دروست کراوەکان کۆدەکاتەوە[٣٢]**

**٧٢_ شیبان بۆی گێڕاینەوە , باوکی أشهب بۆی گێڕاینەوە, لە حەسەنەوە , کە معقل وتی: بە عبد اللّٰه ی کوڕی زیاد: گوێم لێبوو لە پێغەمبەری خواوە دەی فەرموو: هیچ بەندەیەك نیە اللّٰه کەسانێکی خستبێتە ژێر دەستی و بمرێت ڕۆژی مردنی, وە خیانەتی کردبێت لە ژێر دەستەکانی ئەوا اللّٰه بەهەشتی لەسەر حەرامەکات[٣٣]**

---

[٣٢] سەنەدەکەی حسەنە, أبو عتاب سەهلی کوڕی حمادی دلالە, کەسێکی ڕاست گۆیە وەك لە (التقریب:١/٢٣٥_٢٣٦). هاتوە.

[٣٣] حەدیسێکی سەحیحە, بخاری ریوایەتی کردوە (٢٣٥/٤) وە مسلم(١٤٦٠/٣).

**٧٣ _ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو کە پرسیاری لێکرا دەربارەی حەدیسی عەمری کوڕی حزم لە خێر کردندا , ئایا صحیحە ؟**

**فەرمووی: وای دەبینم صحیح بێت**

**٧٤ _ لە حەدیسی خیرکردندا , بۆی گێڕامەوە حەکەمی کوڕی موسی , وەمن پرسیارم لێی کرد, بۆی گێڕاینەوە یەحیای کوڕی حەمزە لە سلیمانی کوڕی داودەوە وتی: زوهری بۆی گێڕامەوە, لە أبو بکری کوڕی محمدی کوڕی عەمری کوڕی ئەویش لە باوکیەوە, ئەویش لە باپیریەوە کە:**

**پێغەمبەری خوا نوسی بۆ خەڵکی یەمەن نوسراوێك دەربارەی واجیاتەکان ...... وە حەدیسەکەی باسکرد**

**٧٥- گوێم لە ئیمامی أحمد بوو : پرسیاری لێکرا دەربارەی گێڕانەوەی ڕەمەزان بە پچڕ پچڕ ( واتە هەموو ئەوڕۆژانەی قەرزاربوە بەسەر یەکەوە نەی گێڕاوەتەوە )**

## فەرموی: واینابینم کێشەی هەبێت[٣٤]

٧٦_ أبوبكرى كوڕی أبی شیبه بۆی گێڕاینەوە , یحییی كوڕی سولەیم بۆی گێڕاینەوە , لە موسی ی كوڕی عوقبەوە , لە محمەدی كوڕی مونكەدیرەوە , وتی: پێم گەشتوە پێغەمبەری خوا پرسیاری لێكراوە دەربارەی گێڕانەوەی قەرزی ڕەمەزان بەشێوەی پچڕ؟

فەرمویەتی: ئایا گەر یەكێك لە ئێوە قەرزێكی لەسەر بێت نایداتەوە؟ گێڕانەوەی درهەمێك یان دوو درهەم , ئایا نابێت بیگێڕێتەوە؟ اللّٰه پێویست ترە تا مافی بۆ بگێڕێتەوە

٧٧ _أبوبكرى كوڕی أبوشیبە بۆی گێڕاینەوە , بۆی گێڕاینەوە حفص ي كوري غياث , لە ابن جورەیجەوە , لە عطاء وە , لە ابن عباس و لە أبی هريرة وە , كە فەتوایان داوە بۆ خەڵكانێك بە گێڕانەوەی ڕەمەزان بە لێك پچڕان و بەسەر یەكەوە نەبوو[٣٥]

---

[٣٤] مسائل إمام أحمد و اسحاق بن راهويه بریوایة اسحاق بن منصور ٧١٥.

[٣٥] سەنەدەكەی سەحیحە , ابن أبی شیبە لە مصنف هێناویەتی بە ژمارە( ٢٩٢/٢ ) وە عبدالرزاقیش بەژمارە( ٧٦٦٤ ).

٧٨ _ أبوبكری كوڕی أبو شیبە بۆی گێڕاینەوە , كوڕی ئیدریس بۆی گێڕاینەوە , لە شعبەوە , لە عبدالحمیدی كوڕی رافعی كوڕی خدیجەوە , لە داپیریەوە , كە رافعی كوڕی خدیج دەی وت:

عیدەكەت حساب بكە و بە ڕۆژو بە چۆنت ویست( واتە بەسەر یەكەوە بیان گێڕیتەوە یان بە جیا)

٧٩ _ أبوبكر بۆی گێڕاینەوە لە یەزیدی كوڕی حوبابەوە , لە معاویەی كوڕی سالحەوە , لە موسی ی كوڕی یەزیدی كوڕی موهب, لە باوكیەوە , لە مالكی كوڕی مخامیرەوە , لە موعازی كوڕی جەبەلەوە , فەرمویەتی: حسابی بكە و بەڕۆژوو بە چۆنت دەوێت , لە گێڕانەوەی ڕەمەزان

٨٠ _ أبوبكری كوڕی أبو شیبە بۆی گێڕاینەوە , بۆی گێڕاینەوە معتمر, لە باوكیەوە , وتی: بەكر هەواڵی پێدام , لە ئەنەسەوە ,

وتی: گەر ویستت ڕەمەزانی لەدەست چوو بگرەوە بەسەر یەکەوە , وە ئەگەر ویستت بەجیا بیگرەوە[٣٦]

٨١ _ باپیرم بۆی گێڕا مەوە , کوڕی عویەینە بۆی گێڕاینەوە , لە زوهریەوە , گێڕایەوە لەوەی بیستبوی لە أبو هرەیرەوە , دەی فەرموو: عیدەکەت حساب کە و , ڕۆژوەکەت بگرە چۆنت پێخۆشە

٨٢ _ باپیرم بۆی گێڕا مەوە , حمادی کوڕی خالد بۆی گێڕاینەوە , وە أبوبکری کوڕی أبی شیبە بۆی گێڕاینەوە , بۆی گێڕاینەوە زەیدی کوڕی حباب , وتیان: معاویەی کوڕی سالح بۆی گێڕاینەوە , لە ئەزهەری کوڕی سەعیدەوە , لە باوکی عامری هوزنی , لە باوکی عبیدەوە , وتی: گوێم لێبوو باوکی عامری هوزنی دەیوت دەربارەی گێڕانەوەی ڕەمەزان: جیای بکەنەوە , وە بەڕۆژوبە چۆنت ویست[٣٧]

٨٣ _ أبوبکری کوڕی أبی شەیبە بۆی گێڕا مەوە , کوڕی علیە بۆی گێڕا مەوە , لە معمرەوە , لە زوهریەوە , لە عبیداللّٰە وە , لە ابن

---

[٣٦] صحيح , رواه ابن أبي شيبة (٢/٢٩٢)
[٣٧] صحيح , رواه ابن أبي شيبة (٢/٢٩٤)

## عباسەوە , دەربارەی گێڕانەوەی ڕەمەزان: بەڕۆژوبە چۆنت ویست[38]

٨٤ _ أبو بكر بۆی گێڕامەوە , وكیع بۆی گێڕامەوە , لەسفیان, لە حبیبی کوڕی أبی ثابت , لە عطاء , لە عبیدی کوڕی عومەیر, دەربارەی گێڕانەوەی ڕۆژوی ڕەمەزان وتی: کێ ویستی بە جیا بی گێڕێتەوە[39]

٨٥ _ باپیرم بۆی گێڕاینەوە , وە أبوبکری کوڕی أبی شەیبە , وتیان: ابن علیە بۆی گێڕاینەوە , أیوب بۆی گێڕاینەوە , لە باوکی قلابەوە , لە عبدالرحمن ی کوڕی محیریز, وتی: عدە بژمێرە و بەڕۆژوو بە چۆنت ویست[40]

٨٦ _ أبوبکری کوڕی أبو شەیبە بۆی گێڕامەوە , ابن ادریس بۆی گێڕامەوە , لە لیس ,و, عطاء , و طاوس , و مجاهد و سعیدي کورِي

---

[38] صحيح , رواه ابن أبي شيبة (٢/٢٩٣), و عبد الرزاق في المصنف ( ٧٦٦٥).
[39] صحيح , رواه عبد الرزاق ( ٧٦٦٦).
[40] اسناده صحيح , رواه ابن أبي شيبة(٢/٢٩٢).

جبير, وتيان : گەرويستت بە دواى يەك بيان گرە , گەرويستت بەجيا بيان گرە

٨٧ _ أبوبكرى كوڕى أبو شەيبە بۆى گێڕاينەوە , باوكى أحوص بۆى گێڕامەوە , لە باوكى اسحاق, لە مجاهد, وتى: گەرويستى بەسەر يەكەوە دەى گرێت , گەرويستى بەجيا دەى گرێت[٤١]

٨٨ _ باپيرم بۆى گێڕامەوە , حمادى كوڕى خالد بۆى گێڕامەوە , لە ليثە وە , لە معاويەوە , لە عبدالله وە , لە باوكيەوە , لە مالكى كوڕى مخامرەوە , لە معازى كوڕى جبلەوە , وتى: جياى كەرەوە و عيدەكەت بژمێرە

٨٩ _ أبوبكر بۆى گێڕامەوە , أبوداودي طياليسي بۆى گێڕاينەوە , لە زهير, لە أبى اسحاق, لە پياوێك لە هاوەڵانى أبى مەيسەرە , كە أبى مەيسەرە گێڕانەوەى ڕۆژوى ڕەمەزانى بە سەر يەكەوە نەدەگرت

[٤١] اسناد رجاله ثقات, رواه ابن أبي شيبة (٣/٢٩٣).

**٩٠ _ أبوبكر بۆی گێڕاینەوە, عبدە بۆی گێڕاینەوە, لە مجاهد, لە شعبی کە فەرمووی: گەر گێڕانەوەکە قورس بوو لەسەری کە بەسەر یەکەوە بیگێڕێتەوە ئەوا بەجیا دەی گێڕێتەوە, لە ڕۆژانی تردا لەدوای نەخۆشیەکەی**

**٩١ _ أبوبکر بۆی گێرامەوە, عبدلاعلی بۆی گێڕامەوە, لە داود, لە عکرمەوە, فەرمویەتی: {فعده من أيام أخر} گەرویستی پێکەوە بێت, گەرویستی بە جیا دەی گرێت[٤٢]**

**٩٢ _ أبو بکر بۆی گێڕاینەوە, یزیدی کوڕی هارون بۆی گێڕاینەوە, لە جوبەیرەوە, لە ضحاکە وە وتي: گەرویستت بەسەر یەکەوە بیان گرە, گەرویستت بە جیا بیان گرە[٤٣]**

---

[٤٢] إسنادة صحيح, رواه ابن أبي شيبة ( ٢٩٣/٢).
[٤٣] مصنف ل'بن أبي شيبة ٩٢١٤.

٩٣ _ أبوبكری كوڕی أبی شيبه بۆی گێڕاينەوە , بۆی گێڕاينەوە ابن نمير, لە اسماعيلی مەكی , لە ربيعەوە , لە عطاء وە لە يەسارەوە وتی: كێشەنيە گەر ڕۆژوی ڕەمەزان بەجيا بگيرێتەوە

٩٤ _ باپيرم و أبوبكری كوڕی أبو شيبه بۆيان گێڕامەوە وتيان: كسيری كوڕی هشام بۆی گێڕاينەوە , لە جەعفەری كوری بورقانەوە , لە مەيمونەوە فەرمووی: گێڕانەوەی ڕەمەزان لە ڕۆژانی تردا دەبێت دوای نەمانی عوزرەكە[٤٤]

٩٥ _ أبوبكری كوڕی أبو شيبه بۆی گێڕاينەوە , ابن أبي غنية بۆی گێڕاينەوە , لە باوكيەوە , لە حەكەمەوە , وای نەدەبينی بە گێڕانەوەی ڕەمەزانی بەسەر يەكەوە نەبوو كێشەی هەبێت[٤٥]

---

[٤٤] إسناده حسن , ابن أبي شيبة( ٢٩٣/٢).
[٤٥] إسنادة صحيح , رواه ابن أبي شيبة في المصنف (٢٩٣/٢).

٩٦ _ باپیرم بۆی گێڕامەوە , أبو قطن بۆی گێڕاینەوە , شعبە بۆی گێڕاینەوە , لە حەکەمەوە , وتی: ابن جریر و مجاهد دەیان فەرموو:
کێشەی نیە گێڕانەوەی ڕەمەزان پچڕ پچڕ[٤٦]

٩٧ _ باپیرم بۆی گێڕاینەوە , ابن علیە بۆی گێڕاینەوە , داودی کوڕی أبی هند بۆی گێڕاینەوە , وتی: عکرمە لە گێڕانەوەی ڕەمەزاندا دەی گێڕایەوە چۆنی ویستایە[٤٧]

٩٨ – گوێم لێبوو لە **أحمدی کوڕی حنبل** دەی فەرموو: ١٠ وشتر لە بری ١٠ پەنجەی دەست وە ١٠ وشتر لە بری ١٠ پەنجەی قاچ ( واتە بۆ هەر پەنجەیەك ١٠ وشتر)[٤٨] , بەڵام بۆ نینۆکەکان پینج یەکی پەنجە کانە , لوتیش ئەگەر برڕا , دەبێت خوێنی تەواوەتی یەك انسان بدات بە لوت بڕاوەکە ( کە ١٠٠ وشترە)[٤٩].

---

[٤٦] إسناده صحيح.
[٤٧] إسناده صحيح.
[٤٨] مسائل للإمام أحمد بن حنبل و اسحاق بن راهوية ٢٣٨٨.
[٤٩] مسائل إمام أحمد بريواية ابنه عبدالله ١٥٢١.

٩٩ _ حكمی كوڕی موسی بۆی گێڕاینەوە , بۆی گێڕاینەوە یحیی ی كوڕی حەمزە , لە سلیمانی كوڕی داودەوە , وتی: بۆی گێڕامەوە زوهری, لە أبی بكری كوڕی محمدی كوڕی حزم, لە باوكیەوە, لە باپیریەوە : نوسی بۆ ئەهلی یەمەن كتابێك كە تێیدا هاتبوو: لە پەنجەیەك لە پەنجەی دەست یان قاچ ١٠ وشتر خوێن بایی هەیە

١٠٠ _ أبوقاسمی كوڕی منیع دەفەرموێت: مصعبي كوڕی عبداللّٰه ی الزبیری باسی كرد وتی: بۆی گێڕامەوە مالكی كوڕی أنس, لە عبد اللّٰه ی كوڕی أبی بكری كوڕی محمدی كوڕی عەمری كوڕی حزم, لە باوكیەوە: لەوكتابەی رسول اللّٰه نوسی بۆعەمری كوڕی حزم هاتبوو: لوت ئەگەر برِا ١٠٠ وشترە[٥٠] , ابن منیع دەڵێت : مصعب بۆی گێڕاینەوە تێنەگەشتم.

١٠١ _ باپیرم بۆی گێڕامەوە, هشیم بۆی گێڕامەوە, ابن أبی لیلی بۆی گێڕامەوە, لە عكرمەوە, كە رسول اللّٰه صلى الله عليه وسلم

[٥٠] الموطأ للإمام المالك بن أنس ( ٥٣٠_ ريواية يحيي / ٢٢٦ ريواية أبي مصعب الزهري) أول كتاب العقل

**حوكمی كرد لە بڕینی لوت بە ١٠٠ وشتر, وە لە پەنجەكان دە دە(واتە هەر پەنجەیەك ١٠ وشتر, دە پەنجە ١٠٠ وشتر دەكات)[٥١]**

**١٠٢ _ باپیرم بۆی گێڕاینەوە , هشیم بۆی گێڕاینەوە , أشعث بۆی گێڕاینەوە , لە شەعبیەوە , لە مسروقەوە , وتی: عبداللّٰه وتی: بۆ لوت خوێن بایی هەیە (١٠٠ وشتر), بۆ ١٠ پەنجەكان , ١٠وشتر بۆ هەر پەنجەیەك[٥٢]**

# كۆتایی مسائل

[٥١] مصنف عبدالرزاق ١٧٤٥٨.
[٥٢] مصنف عبدالرزاق ٦٧٩٤ , مصنف ابن أبي شيبة ٢٧٣٦٦.